
چیرۆکی ئەفسانەی خۆشەویستی
نووسەر: سەمەد بێهرەنگی
وەرگێڕ: عەدنان هونەروەر
شێوەکار:سروە نیک خا



# ئەفسانەی خۆشەویستی

**نووسەر: سەمەد بێهرەنگی**

**وەرگێڕ: عەدنان هونەروەر**

**نیگارکیش: سروە نیک‌خا**



ناوی کتێب: ئەفسانەی خۆشەویستی
بابەت: چیرۆک بۆ منداڵان
تایبەت بە: مێرمنداڵان
نووسەر: سەمەد بێهرەنگی
وەرگێڕ: عەدنان هونەروەر
نیگارکیش: سروە نیکخا
ژمارەی سپاردن لە هەرێمی کوردستان: ژمارەی (١٤١٤) ساڵی ٢٠١٢
چاپ: دەزگای چاپ و پەخشی ناوەندی کولتوری کورد لە نوێرنبێرگ/ئاڵمان
تیراژ: ١٠٠٠

ئەم وەرگێڕانە پێشکەش بێت
به کوڕی خۆشەویستم

"ژیلوان هونەروەر"



رۆژێک،رۆژگارانێک پاشایەک هەبوو کیژۆڵەیەکی شەش – حەوت ساڵانی هەبوو. ئـەم کیـژە، کارەکەر و کوڵفەتی زۆری هەبوو. نۆکەرێکیشی هەبوو تۆزیک لە خۆی هەڵکشاوەتر بوو. ناوی"قووچ عەلی"بوو.
کاتی چێشت خواردن ئەگەر دەستە سڕی کچە سەر زەوی بکەوتایـە، قـووچ عـەلی پێـی دەدایـەوە. کاتی کایە ئەگەر تۆپەکەی دوور بکەوتایەتەوە،قووچ عەلی بۆی دەهێنایەوە. کاتی وەهاش بـوو، کچی پاشا لە ملیۆنان ئامێری کایە بێزار دەبوو هەوەسی هەلووکێنی دەکرد. هەلووکی کچی پاشـا لە زێڕ و زیوو بوو. یەکەم جار کە حـەزی لـە یـاری هـەلووکێن کـرد، پاشـا تـەواوی زێڕنگـەرانی شاری کۆ کردەوە و پێی وتن: ئەبێ تا کاتژمێرێکیتر دوو هەلووک بۆ کچەکەم ئامادە بکەن.



هەلووکەکان سەد هەزار تمەن؛ بگرە زیاتریش خەرجیان بوو. زێڕینگەرێکیش لە سەر ئەم کارە کوژرا. چوونکا وتبووی کاری دیکەی هەیە و ناتوانێ ئامادە بێت؛ خەریکی دروست کردنی گوارە بوو بۆ کچەکەی خۆی.

هەر کاتێ کچی پاشا هەوەسی هەلووکێنی دەکرد قووچ عەلی لە شوێنێک رادەوەستا و چاوەڕوانی دەبوو. کچی پاشا دارە کوڵە زیووەکەی لە سەر زەوی دادەنا، بە دارە درێژە زێڕەکەی دەیدا بە سەریدا و هەڵیدەخستەوە بە حەوادا. ئەرکی قووچ عەلیش ئەوە بوو؛ ڕا کات بە دوای دارەکەدا و هەڵی بگرێت و بیخاتەوە بۆ کچەکە. کچە لە حەوادا بە زەبر لێی دەدا و دوورتری دەخستەوە. قووچ عەلی دیسان دەڕۆیشت و هەڵی دەگرت و دەی خستەوە بۆ کچەکە.

کاتێ کچە ماندوو دەبوو، قووچ عەلی دەڕویشت و کارەکەرکانی ئاگادار دەکردەوە. دەهاتن کچەیان لە سەرتەخت دادەنا و دەیانبردەوە بۆ نێو کۆشکەکەی. قووچ عەلیش دەرۆیشت و خەزێنەداری تایبەتی ئامێری کایەکانی ئاگادار دەکردەوە کە بێت و هەلووکەکان ببات و لە لای

ملیۆنان ئامێری کایەی دیکە دایان بنێت. هەروەها قووچ عەلی دەڕۆشت خەزێنەداری جل و بەرگی کچی پاشای ئاگادار دەکردەوە جلی تایبەتی چێشت خواردن بۆ کچە بێنێت و جلی هەلووکێن ببات و لە سەر جێگای خۆی دایان بنێت.

قووچ عەلی دیسانەوە دەڕۆیشت و چێشت لێنەری تایبەتی پاشای ئاگادار دەکردەوە کە چێشتی دوای هەلووکێن بۆ کچە بێنێت، کچی پاشا دوای هەر کایەیەک چێشتی تایبەتی دەخوارد.

قووچ عەلی بەردەوام سەرقاڵی ئەم ئیشانە بوو. کاتێ کچە دەنووست ئەرکی ئەوە بوو لە پشتی دەرگاکەوە بخەوێت تاکوو کارەکەر و نۆکەرەکان بزانن خاتوون خەوتوە و نابێ ورتەیان لێوە بێت.

کچی پاشا هەر کارێکی هەبوایە قووچ عەلی بە خۆشیەوە جێ بە جێی دەکرد. ئیشەکانیشی ئەوەندە ڕێک و پێک بوون هیچ کات کچی پاشا تەمێی نەکردبوو. قووچ عەلی عاشقی کچی پاشا



بوو. زۆر دڵپاکانە خۆشی دەویست. دەیزانی هیچ نکوولییەک لە کاریدا نییە. هەر بەم بۆنەوە رۆژیک رازی دڵی خۆی بۆ کچە درکاند.



ئەو رۆژە کچە لە باخدا خەریکی راوە پەپوولە بوو. قووچ عەلیش لە ژێر دارێکدا وەستابوو سەیری دەکرد و کاتێ پەپوولەیەک دەڕۆیشتە سەر دارێک قووچ عەلی لە دارەکە سەر دەکەوت و پەپوولەکەی هەڵ دەفڕاند. جارێکیان کچە پەپوولەیەکی گەورەی چاو پێ کەوت. قووچ عەلی قاو کرد و وتی: “قووچ عەلی وەرە ئەمە تۆ بیگرە؛ ئەمن لێی دەترسم”.

قووچ عەلی هەڵات و پەپوولەکەی گرت و خستیە نێو سەوەتە تۆڕیەکەی. کاتێ سەری هەڵبڕی روانی، کچە لە بەردەمیا وەستاوە؛ دڵپاک و ساکار پێی گوت: “شازادە خانم من عاشقی ئێوەم. تکات لێ دەکەم کاتێ هەر دووکمان گەورە بووین ببی بە هاوژینی من”.

 

بەڵام هێشتا قسەکەی نیوە چڵ بوو، کچی پاشا شەقەزیلەیەکی چاکی تێ سرەواند و هاواری کرد: "نۆکەری بێ دەست و پێ؛ تۆ حەقت نییە عاشقی من بیت... مەگەر لە بیرت چوە من شازادەم و تۆ نۆکەری منی؟ تۆ شیاوی دەرگاوانی سەگی منیشت نیە. بەچکە سەگ.. ون بە لە پێش

چاوم.. ئادەی برۆ بڵێ بە کڵفەتەکانم بێن بمبەنەوە، تۆیش دەرکەن ئیتر نامەوێ چاوە پیسەکانت بە مندا هەڵبێت".

قووچ عەلی ڕۆیشت و کڵفەتەکانی ئاگادار کردەوە؛ کڵفەتەکان بە تەختەوە هاتن. ڕوانیان کچی پاشا لە سەرخۆچووە. ڕژان بە سەر قووچ عەلی دا کە چیت بە سەر کچی پاشا هێناوە، قووچ عەلی وتی: "ئەمن هیچم لێ نەکردوە خۆی تووڕە بوو و لێی دام و لە سەر خۆ چوو... بە کێ و بە کێ قەسەم"!!

بەڵام کێ بڕوای پێ دەکرد. گوڵاو و شەربەتیان هێنا کچە هاتەوە سەرخۆ و لە سەر تەخت دایانا و بردیانەوە بۆ کۆشکەکەی. کچی پاشا وتی: "بڵێن بە باوکم گوێی ئەم نۆکەرە، سپڵە، پیسە بگرێت و وەک سەگ لە کۆشک دەری کات. ئیتر نامەوێ چاوە پیسەکانی بە مندا هەڵبێت".
پاشا هەر ئەو ساتە فەرمانی دەرکردنیدا، ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە هەر وەک سەگیش کردیانە دەرەوە، کچی پاشا چەند ڕۆژیک نەخۆش کەوت، هەموو ڕۆژیک چەند دوکتورێک بە لایەوە ئامادە بوون دواتر وتی کە چاک بووەتەوە. ئیتر دەست بەرداری دوکتورەکان بوو.

*       *       *

سالآن رابورد و کچی پاشا هەر رۆژ و هەر ساڵ لە خۆبایی تر لە پێشوو دەبوو، کەسی بە سەگیش حەسێب نەدەکرد تا ئەو رادەیە، کاتێ تەمەنی حەفدە-هەژدە سالآن بوو دەستووری دابوو هیچ کەسێک بۆی نیە سەیری بکات و لەشی پاکی بە چاوە پیسەکانی چەپەڵ بکات.



ئەگەر یەکێک لە نۆکەرەکان بە ئەنقەست چاوی پێی بکەوتایە لێدانێکی چاکی دەخوارد و ئەگەر دەمی بکردایەتەوە و شتێکی بگوتایە بە زیندووی دەیانخستە بەر گورگە برسیەکانی کچی پاشا کە بۆ رابواردنی خۆی لە باخدا بەخێوی دەکردن. بە بۆنەی ئەم کارانەیەوە، پاشا کچەکەی زۆر خۆش دەویست.

بەردەوام بە کچەی دەگوت: “کچم تۆ خەریکی ڕێگای من درێژە پێ دەدەی، خۆشم دەوێی”.
کچی پاشا وەهای لێ هاتبوو بەردەوام لە نێو باخدا بە تەنیایی دەگەڕا و لە گەل کەسیشدا قسەی نەدەکرد.
دەی گوت: “کەس شیاوی قسە کردن لە گەل منی نییە”.



دوو گۆمی گەورەشی لە ناوە راستی باخەکەدا دروست کرد بوو یەکێکیان هەمیشە پڕ لە شیری تازە بوو، ئەوی دیکەیشیان پڕ لە گوڵاو و عەتری گوڵانی سوور و زەرد و ئەو شتانە بوو. هەروەها دوو کارەکەری گەنجیشی هەبوو؛ ئەرکیان ئەوەبوو لە کاتی خۆیدا سەریان داخەن و تا لێوارەی گۆمەکە بێن. دواتر کچە لە گۆمی شیر بێتە دەرەوە و بچێتە ناو گۆمی

گوڵاوەکە و دواتر خۆی بپێچێتە ناو خاولیەکەی. کارەکەرەکان نەئەبوایە دەستیان بکەوتایە لە لەشیەوە. ئەگەر نووکی قامکی یەکێکیان لە پێست و مووی بکەوتایە هەر ئەو ڕۆژە دەدرایە دەستی جەردەوانەکان تا قامکی یان دەستی ببڕنەوە.

کچی پاشا بەم ئیشانەی زۆربەی کەسەکانی لە خۆی دوور خستبوەوە و تاک و تەنیا مابوویەوە و نەیدەزانی چۆن کاتی خۆی رابوێرێ. ئیتر لە پەپوولە گرتن و گوڵ چنینەوە و خۆشۆردن لە نێو شیر و گوڵاو و ئامێری کایە و خواردنەوە و خواردن و سەیری گورگەکانیش، تێر بوبوو. بە ناچاری زۆربەی کات دەنووست. هەمیشە قووچ عەلیشی بە خەون دەبینی. قووچ عەلی دەهات لە گەل کچی پاشادا کایە بکات. کچە لە سەرەتاوە شاد دەبوو. لە پڕ وەبیری دەهاتەوە کە کچی پاشایە و لە گەل خەڵکیتر جیاوازی هەیە. ئەو کاتە لە خۆبایی دەبوو و قووچ عەلی لە خۆی دوور دەخستەوە. بەڵام قووچ عەلی وازی لێ نەدەهێنا و دەیویست دەستی بگرێت. کچە دەیویست دەستی بکشێنێتەوە. لە ئاکامدا هەر قووچ عەلی بوو کە دەیتوانی نەهێڵێت دەستی بەرەڵا بکات.

ئیتر هەر دووکیان پێکەوە دەستیان دەکرد بە یاری و هەڵاتن و پەپوولە گرتن لە نیوەی یاریەکەدا قووچ عەلی دەی گوت: "شازادە خانم من عاشقی ئێوەم. تکات لێ دەکەم کاتێ هەر دووکمان گەورە بووین ببی بە هاوژینی من".

لێرەدا دیسانەوە کچە وەبیری دەهاتەوە، کچی پاشایە شەقەزیلەیەکی لە قووچ عەلی دەدا و هەرا و هاواری دەکرد. قووچ عەلیشی دەدایە دەستی جەردەوانان و لە پڕ بە دەنگی هاواری خۆیەوە لە خەو رادەچڵەکی.

هەمیشە ئەم خەونەشی دەبینی. نەیدەتوانی هاوکایەیەکی دیکە بە خەون ببینێت. تازە قووچ عەلیشی هەر لەو ساڵانەی منداڵیدا بە خەون دەبینی.

کچی پاشا خوازبێنیشی هەبوو. چەند شازادەیەک لە وڵاتانی دوورەوە بۆ خوازبێنی دەهاتن بەڵام هەر چاو پێ نەکەوتوو دەستی دەنا لە روویانەوە و جوابی دەکردن و دەی گوت:
"من بێجگە لە خۆم کەسی دیکەم خۆش ناوێ".



رۆژێکیان کچی پاشا لە نێو گۆمەکەدا خۆی دەشۆرد. کۆترێک هات و لە سەر لقی دار هەناری قەراخ گۆمەکە نیشتەوە و وتی:



“ئەی کیژە جوانکیلەکە؛ تۆ چەند لەشت جوانە! من عاشقی تۆ بووم. تکات لێ دەکەم لە نێو شیرەکەدا وەرە دەرەوە تا بە جوانی سەیرت کەم”.

کچی پاشا وتی: “ئەی پەلەوەری ناشیرین، دەستوورت پێ دەدەم لێرەدا بڕۆی؛ من شازادەم. کەس ناتوانێ سەیری من بکات. کەس بایی ئەوەندە نییە لە گەل مندا قسە بکات”.

کۆتر پێکەنی و وتی: “ئەی کیژە جوانکیلەکە، من دەزانم کە ماوەیەکی زۆرە کەس نەبووە قسەی لە گەل بکەیت...”.

کچە لە بیری چووەوە کچی پاشایە و کتوپڕ نەرم بوو؛ وتی: “ئەی کۆتری خۆش کەلام، تکات لێدەکەم سەیری من مەکە؛ جوان نییە”.

کۆتر وتی: "ئەی کیژە جوانکیلەکە بە دەستی خۆم نییە سەیرت نەکەم. خۆشم دەوێی".

کچە وتی: "ئەی کۆتری شیرین کەلام،من ناتۆانم عەشقی کۆترێک قەبووڵ بکەم ئەگەر بە راستی ئەویندارێکی راستەقینەیت لەم قاواخەی خۆت وەرە دەرەوە با منیش سەیری تۆ بکەم".

کۆتر وتی: "ئەی کیژی جوانکیلە، من دڵخۆش نییم بەوەی کە تۆ عەشقی من قەبووڵ بکەی. شتێک بە بارەمتە دابنێ تا دڵخۆش بم و لە دۆخی خۆم بێمە دەرەوە".

کچە وتی: "ئەی کۆتری خۆش کەلام! هەر شتێکت دەوێ بفەرموو با بتدەمێ".

کۆتر وتی: "ئەی کیژە جوانکیلە! خەوت بدە بە من".

کچە وتی: "ئەی کۆتری خۆش کەلام! خەوی من بە چ کەڵکی تۆ دێت".



کۆتر وتی: “ئەی کیژی جوانکیلە! دواتر دەزانی کە خەوی تۆ بە چ کەڵکی من دێت”.

کچە وتی: “ئەی کۆتری خۆش کەلام! خەوی من بۆ تۆ”.

لەم کاتەدا دەنگی پێی کارەکەرەکانی کچە هاتە گوێی کە خاولی بە دەستیانەوە، سەریان داشۆڕاندبوو و دەهاتن.

کۆتر وتی: “ئەی کیژە جوانکیلەکە، ئێستا خەوت هی منە. کارەکەرەکانت خەریکن دێن. من دەڕۆم دواتر دێمەوە. من ناوم نایت ”قیزخانم” جوان نییە کیژێکی وەک تۆ ناوی نەبێت”.

کچە لە پڕ وەبیری هاتەوە کچی پاشایە بۆیە قیڕاندی: “ئەی حەیوانی چەپەڵ تۆ بە چ حەقێک لە گەل مندا قسەت کرد. خەوەکەم پێ بدەرەوە. ئەگینا دڵ و ریخۆڵەت لە پشتە ملەوە دەردەهێنم. تۆ حەقت نییە بەو دەمە چەپەڵەت نێو لە سەر من دابنێیت”.



بەڵام کۆتری سەرچڵی دارهەنارەکە دەمێک بوو، هەڵفڕیبوو. کچی پاشا لە خۆڕا خۆی تووڕە دەکرد و جەردەوانانی بۆ یارمەتی بانگ دەکرد.



ماوەی چەند حەوتوویەک تێپەڕی بەڵام کچی پاشا تەنانەت بۆ ساتێکیش نەنوستبوو. ئاخر خەوی نەدەهات. لە سەرەتاوە بێ خەوی وەهای لێ کردبوو، هەمووان وایان دەزانی شێت بووە. چەشنی سەگی هار لە هۆدەکەیدا هات وچۆی دەکرد. چنگی بە دار و دیواردا هەڵدەخست. جنێوی بە هەمووان دەدا. نەیدەهێشت کەس بێت بە لایدا تەنانەت باوکی و دوکتورەکانیش. رۆژان و شەوان بە تاک و تەنیا مایەوە. لە ئاکامدا ماندوو و نەخۆش؛ بە تەواوی پەکی کەوت. هیچ کە هەر خەوی لێ نەدەکەوت؛ ئیتر نە قسەی دەکرد و نەدەشجووڵایەوە.

ئەم جارەیان دەیهێشت دوکتورەکان بڕۆنە ژوور سەری بەڵام هیچ دوکتورێک نەیدەتوانی کچە چاک بکاتەوە چونکا پاشا دەستووری دابوو، هیچ کەس بۆی نییە دەستی لە لەشی کچەکەی بکەوێت ئەوەبوو دوکتورەکان نەیاندەتووانی بزانن دەردی کچە چییە. رۆژێک دوکتورێکی پیر و غەریب هات و وتی:
"من بێ ئەوەی دەستم لە لەشی نەخۆش بکەوێت دەتوانم چارەسەری بکەم و دەوایشی بۆ دابنێم. ئەگەر نەمتوانی لە سێدارەم بدەن".

پاشا فەرمانیدا بیبەنە لای کچە. کابرای پیر ماوەیەکی دوور و درێژ لە تەنیشت کچە دانیشت و سەیری کرد. دوایی وتی: "چارەسەری ئەم کچە "ئەفسانەی خۆشەویستییە". ئەبێ کەسێک بێتە ژوور سەری ئەفسانەی خۆشەویستی بۆ بڵێت تا کوو بتوانێ بخەوێت و چاک بێتەوە".

پاشا دەستووریدا جارچییەکان لە چوار سووچی شار جارٍ لێ بدەن: "هەر کەسێ ئەفسانەی خۆشەویستی دەزانێ بێت و بیگێڕێتەوە بۆ کچی پاشا هەتا کوو پاشا لە ماڵی دونیا بێ نیازی کات".

زۆر کەس بۆ تەماحی ماڵ هاتن کە ئێمە "ئەفسانەی خۆشەویستی" دەزانین، بەڵام کاتێ دەڕۆیشتنە پشت پەردەی هۆدەی کچەکە مەجبوور دەبوون هەندێک درۆ ساز بکەن؛ هەر بۆیە لە کچی پاشادا هیچ گۆڕانێک بەدی نەدەکرا. پاشایش هەموویانی دەدایە دەستی جەردەوانان. ئیتر کەسێک ورزەی نەبوو بێتە پێشەوە.
چەند رۆژیک تێپەڕی. دیسانەوە چارەسەرکەری پیروغەریب هاتەوە:
" ئەمە چ شارێکە کەس ئەفسانەی خۆشەویستی نازانێ". لە فلانە کێودا شوانێکی لاو هەیە ئەو ئەفسانەی خۆشەویستی دەزانێ. ئەوەش بزانە کە ئەگەر خۆت لە دووی نەڕۆی، هەرگیز لەو کێوەوە نایەتە خوار".



چارەسەرکەر لێیدا و رۆیشت. پاشا لە گەڵ چەند کەسێک سواری ئەسپ بوون و رێکەوتن. رۆیشتن تا گەیشتنە داوێنی چیاکە. شوانەکەیان قاو کرد. شوان لەسەر کێوەکەوە وڵامی دانەوە: "ئێوە کێن، ئیشتان بە من چییە"؟

پاشا وتی: "من پاشام، مەگەر تۆ نازانی کچی من نەخۆشە؟ ئەمەوێ بێیت و بۆی..."

پاشا لە بیری چوو بوەوە کە چارەسەرکەر چی پێ وتبوو. شوانە وەبیری هێنایەوە: "ئەفسانەی خۆشەویستیت دەوێ"؟

پاشا وتی: "ئەرێ هەر ئەوەی کە وتت. کابرایەک دەڵێت کە تۆ دەیزانی".

شوان وتی: "ئەرێ دەیزانم".

پاشا وتی: "ئەگەر کچەکەم چاک بکەیتەوە هەر چەندە زێڕ و زیوو و ماڵت بوێت. دەیدەم".

شوان لە کاتی هاتنە خوارەوە لـە کێوەکـەوە وتـی: "پاشـا! ئەگـەر قسـەی مـاڵی دونیـایی بێنیتـە ئاراوە،من نایەم. ئەفسانەی خۆشەویستی هەر لەبەر خۆشەویستی دەوترێ".

پاشا ئیتر هیچی نەوت. حەزی دەکرد ئـەم شـوانە زمـان درێـژە بسـپێرێتە دەسـتی جەردەوانـەکان بەڵام هیچی نەوت. شوان لەگەل پاشادا سواری ئەسپێک بوون و بەرێ کەوتن.
کاتێ گەیشتنە کۆشکی شاهی،شوانەکەیان لە پشت پەردەوە دانا و پێیان وت: "هـەر لێـرەوە بیڵـێ چاوی کەس نابێ بە روومەتی کچی پاشا بکەوێت".

شوان وتی: "ئەفسانەی خۆشەویستیش وەهـا نییـە هـەر کـەس بتـوانێ گـوێی لـێ بگـرێ. ئەگـەر بێجگە لە من و کچە کەسێکی دیکە بەم دەور و بەرا بێت (گێـڕانەوەی) ئەفسـانەکە بـە کـەڵک هـیچ نایەت. هەمووان دوور کەونەوە".

پاشا بە ناچاری وتی کۆشکی کچە چۆڵ بکەن. لە نێو کۆشکدا بەس شوانە مایەوە و کچی پاشا. ئەو کاتە شوانە پەردەی هەڵ دایەوە و رۆیشتە نێو ژوورەکە. کچە لە سەر خۆ پاڵ کەوتبوو. هـیچ

سەرنجێکی بە کەس و بە هیچ شتێک نەبوو. شوان لە تەنیشت دەرگاوە دانیشت و بە دەنگی بەرز وتی: "ئەی کیژە جوانکیلە، ئەی قیزخانم دەمەوێ ئەفسانەی خۆشەویستیت بۆ بڵێم گوێت لێیە"؟



کچە وەک بڵێی دەنگێکی ئاشنای بیستوە رووی هەڵ گەڕاندەوە وچاوی بڕیە شوان و وتی: "ئەرێ گوێم لێتە، بیڵێ".

شوان دەستی کرد بە گێڕانەوەی ئەفسانەی خۆشەویستی و وتی:

"رۆژێک، رۆژگارانێک پاشایەک هەبوو کچێکی شەش، حەوت ساڵانی هەبوو، ئەم کیژە کارەکەر و کوڵفەتی زۆری هەبوو نۆکەرێکیشی هەبوو، تۆزیک لە خۆی گەورەتر بوو بە ناوی "قووچ عەلی".

کاتی چێشت خواردن ئەگەر دەستە سڕی کچە سەر زەوی بکەوتایـە، قـووچ عـەلی پێـی دەدایـەوە. کاتی کایە ئەگەر تۆپەکەی دوور بکەوتایەتەوە،قووچ عەلی بـۆی دەهێنایـەوە.کـاتی وەهـاش بـوو کچە هەوەسی هەلووکێنی دەکرد. هەلووکی کچی پاشا لە زێڕ و زیوو بوو.

کاتێ کچە دەنووست؛ ئەرکی ئەوە بوو لە پشتی دەرگاکەوە بخەوێت تا کو کارەکەر و نۆکەرەکان بزانن، خاتوون خەوتوە و نابێ ورتەیان لێوە بێت.

کچی پاشا هەر ئیشـێکی هەبوایـە قـووچ عـەلی بـە خۆشیەوە بـە ئەنجـامی دەگەیانـد. لـە بەر ئەوەی ئیشەکانی رێک و پێک بوون، ئیتر کچی پاشـا هـیچ کـات تـەمێی نـەکردبوو. قـووچ عـەلی عاشقی کچی پاشا بوو. زۆر دڵپاکانە خۆشی دەویست. دەیزانـی کـە هـیچ نکوولییـەک لـە کاریـدا نییە. ئاخر خۆشەویستی و ئەویندارى بۆ دەبێ عەیب و عار بێت؟



کاتێ لە نێو باخدا بوون و کچی پاشا خەریکی پەپوولە گرتن دەبوو، یان هەلووکێنی دەکرد، قووچ عەلی ئەوەندە سەرحاڵ و بزێو بوو کە هیچ سنووریێکی بۆ دانەئەنرا. قەد لە سەیرکردنی تێری نەدەخوارد. حەزی دەکرد، کچە بهێڵێت دەستی بگرێت و پێکەوە پیاسە بکەن و پەپوولە بگرن.

بەڵام کچی پاشا کەسی پەسەند نەدەکرد. تەنیا وشەی سەر زاری بۆ کارەکەر و نۆکەرەکانی بێجگە لە"سەگ"، شتێکی دیکە نەبوو. نەیدەهێشت کەسیش توخنی کەوێت.

قووچ عەلی لە دڵەوە یەکجار خۆشحاڵ بوو. تاکوو رۆژێکیان هەستی کرد کە ئیتر ناتوانێ نهێنی دڵی بە کچە نەڵێت. هەر بۆیە رۆژێک کاتی پەپوولە گرتن بە کچەی وت:
"شازادە خانم من عاشقی ئێوەم. تکات لێ دەکەم کاتێ هەر دووکمان گەورە بووین ببی بە هاوژینی من".

کچی پاشا زۆر بەم قسەیە قەڵس بوو. شەقەزیلەیەکی لە قووچ عەلیدا و بە دوای ئەوەشدا وەک سەگ لە خۆی دووری خستەوە و قەد بیریشی لێ نەکردەوە چیی لێقۆما.

شوان بێدەنگ بوو. کچە وتی: "بڵێ دواتر چی روویدا"؟



شوانە وتی: “ئەی کیژۆڵە جوانکیلەکە، بە بڕوای تۆ چی بە سەر قووچ عەلیدا هات بێت”؟

کچە وتی: “ئەمن قەد بیرم لێ نەکردوەتەوە، قووچ عەلی چی بە سەر هاتبێت. تۆ دەزانی قووچ عەلی ئاکامی بوو بە چی؟ وەرە پێشەوە بۆم بڵێ”.

شوانە هەستا و ڕۆیشت لە تەنیشت تەختی کچە دانیشت و درێژەی ئەفسانەی خۆشەویستی بەم شێوەیە گێڕایەوە:

“باوکی قووچ عەلی شوان بوو. بە پێی پەتی رۆیشت بە دەشتا و باوکی لە سەر چیا دۆزیەوە. باوکی زۆر نەخۆش بوو و لە ئەشکەوتی مەڕەکاندا پاڵکەوتبوو”.

خوشکی قووچ عەلی،هاوتەمەنی خۆی بوو. مەڕەکانی بۆ لەوەڕاندن بردبوو...

باوکی بە چاو پێکەوتنی کوڕەکەی زۆر خۆشحاڵ بوو و وتی: “قووچ عەلی گیان؛ لە کاتێکی باشدا هاتویتەوە من خەریکم دەمرم. خوشکت بە جێ مەهێڵە. تەنیایی دەردێکی پیسە”.

باوکی مرد. قووچ عەلی هەر لە سەر کێوەکەدا نایە ناو گۆڕ. ئێوارە خوشکەکەی هاتەوە لە جیاتی باوکی، براکەی بینی. پێکەوە بۆ باوکیان گریان و لە سەر گۆڕیشی گوڵ و نەمامیان چاند.

رۆژان و مانگان و ساڵان تێپەڕی. قووچ عەلی و خوشکەکەی بوون بە حەڤدە، هەژدە ساڵان. پێکەوە چیا و بژوێنیان دەپێوا و مەڕەکانیان لە چاکترین جێگادا دەلەوەڕاند. شەوانیان لە گەل



سەگەکانیان دا دەبردە سەر. لە زستاندا جار جارێک دەهاتن بۆ شار. ئەو کاتەی کە مەڕەکان لە ئەشکەوتی زستانەدا بوون. کاتی پشوودانیان بوو.

خوشکی قووچ عەلی وەک شەماڵ نەرم و نیان بوو. چەشنی هەتاوی هاوینە دەدرەوشایەوە. وەک میوەکانی پاییز بۆن خۆش و دلڕفین بوو. چەشنی مانگی شەوانی زستان ساکار و دلڕفێن بوو. روومەتیشی وەک هەڵاڵە برمە سوور و لە خۆبوردو بوو بەم بۆنەیەوە قووچ عەلی بانگی لێ دەکرد "هەڵاڵە".
رۆژێک ئەوکاتەی مەڕکانی دەهێنایەوە قووچ عەلی سەیری کرد،بزنێک لە رانەکەی ون بووە. لەگەل یەکێک لە سەگەکانی چوون بە شوێن بزنەکەدا. چەند چیایان نایە ژێر پێ دواتر زانیان بزنەکە لەسەر کارێزەکە دانیشتوە و دەگریەت و وەک شەق شەقە هەڵدەلەرزێ.

سەگەکە چاوی بە بزن کەوت دەستی بە وەڕین کرد و وتی: "بزن گیان مەگری ئەوە نییە هاتووین بۆ لات".



بزن شاد بوەوە و وتی: "دەترسام نەیەن بە دوامدا و ببم بە قسمەتی مام گورگ. زۆر سوپاس بۆ ئێوە".

دەمەو ئێوارە بوو. قووچ عەلی سەیری کرد لە داوێنی کێوەکەدا حەوت ئەسپی سپی خەریکن دێنە سەرەوە.
بزنەکەی دایە دەستی سەگەکە و بەڕێی کردن. خۆیشی لە پشت بەردێکەوە چاوەڕوان مایەوە.
ئەسپەکان لەکارێزەکە هاتنە دەر. هەر کامیان کونەیەک لەسەر پشتی بوو. پڕیان کرد لە ئاو. ویستیان بگەڕێنەوە، یەکێک لە ئەسپەکان وتی:
"من ئیتر ناتوانم بە تاقی تەنیا لەو کۆشکەدا بژیم. هەر لێرەدا خۆم دەکوژم یان دەگەڕێمەوە بۆ شاری خۆم ئێوەش بگەڕێنەوە بۆ لای کچە ئامۆزاکانمان".

ئەسپەکانی دیکەش دڵخۆشییان دایەوە لە ئاکامدا پێکەوە گەڕانەوە. قووچ عەلی هەستا کەوتە شۆێن ئەسپەکان. ڕۆیشتن،ڕۆیشتن چەند کێویان نایە ژێر پێ. گەیشتنە دارستانێکی چۆڵ و هۆڵ کە تەنانەت بچووکترین پەلەوەر و مار و مێرو و ئاژەڵێکی تێدا نەبوو. حەوت کۆشکی ڕازاوەی تێدا بەدی دەکرا. هەر کام لە ئەسپەکان، ڕۆیشتنە ناو یەکێک لە کۆشکەکانەوە. قووچ عەلی چاوەڕوان ما. سەیری کرد شەش کۆتری سپی لە ئاسمانەوە هاتنە خوارەوە وهەر کامێکیان ڕۆیشتنە ناو یەکێک لە کۆشکەکانەوە. قووچ عەلی دیسان چاوەڕوان دانیشت.

دەنگی گریان و ناڵەناڵیک دەهات؛ ڕۆیشت سەیری کۆشکەکانی کرد. ڕوانی لە هەر کام لە کۆشکەکاندا کچێک وەک مانگ و کوڕێکیش وەک هەتاو گەرمی قسەو پێکەنینن.
بەڵام لە کۆشکی حەوتەمدا کوڕێک وەک هەتاو تاق و تەنیا دانیشتوە بە لەتێک گەچ وێنەی گوڵی هەڵاڵە دەکێشێت. خەریکی شین و گریانیشە. وەها شینێک کە دڵی بەردیشی کەباب دەکرد.

قووچ عەلی ڕۆشتە ژوورەوە سڵاوی کرد و وتی: "ئەی لاوی گەنج مەگری. دڵم بوو بە کەباب بۆت".

کاکی‌لاو سەری هەڵێناو وتی: “تۆ کێیت؟ لە کوێوە هاتویت”؟

قووچ عەلی وتی: “من شوانی کوێستانم. دەنگی گریان و ناڵەناڵت منی بۆ ئێرە کێشاوە”.

کاکی‌لاو وتی: “سەر لە بەیانی لە سەر چیا تۆم بینی. چاکت کرد هاتی وەرە دانیشە دڵم هاودەنگی دەویست”.

قووچ عەلی دانیشت و وتی: “باشە لە بەر چی، بۆچی دەگریایت”؟



کاکیلاو وتی: “بەسەر هاتی من نـەختێک دوور و درێـژە ئەگـەر ئۆقرەی بیستنیت هەیـە، بۆتی دەگێڕمەوە... .”

“ئێمە حەوت براین. دوو رۆژ نابێ هاتوینەتە ئـەم دارستانەوە. لـە شـاری خۆمـان ئاسنگەریمان دەکرد. باوکێکی پیرمان هەبوو. باشترین شمشێرسازی شـار بـوو. بـە رۆژ ئاسـنگەریمان دەکـرد و شەوانەش بە نهێنی لە ژێرزەوینەکەماندا شمشێرمان دروست دەکرد. پاشـا دروسـت کردنـی چـەکی قەدەغە کردبوو، بەڵام چونکا خەڵکی شار شمشێریان پێویست بوو، ئێمە ناچار بووین بە شەوانە ئیش بکـەین. لـە دووکانەکەمانـدا سندانێک هـەبوو دە، بیست ئەوەنـدەیی سندانە خۆماڵیـەکان ئەبوو. هەشت نەفەری دەورەمان لێ دەدا. رۆژێک باوکمان پێی وتین:

“کوڕینە من ئیتر خەریکم دەمرم. بـەڵام ئێـوە سـاڵانی دوور و درێـژ ژیـان دەکـەن و پێویسـتان بـە هـاوڕێ و هـاوژین دەبـێ. کـاتی ژن هێنانیشـتان هـاتوە. ئێـوە ژنێکتـان دەوێ وەک خۆتـان قـۆڵ هەڵماڵێ و پیک لێ بدات و شمشێر دروست کات. کچە ئامۆزاکانتان دەتوانن وەها هاوسەرێک بـن

بۆتان. بەڵام بۆ ئەوەی ئێوەش جەربەزەی خۆتان پیشان بدەن. من و مامی خواعەفووکردوتان مەرجێکمان بۆ داناون. ناونیشانی ئامۆزاکانتان وا لە ناو ئەم سندانە دایە. ئێوە دەبێ شمشێرێکی هێندە تیژ دروست بکەن کە بتوانێ یەکان دەر دوو ئەم سندانە بقڵیشێنێ. تاکوو ناونیشانی کچە ئامۆزاکانتان لە ناویدا بدۆزنەوە”.

باوکمان دوای چەند رۆژێک لە دونیا دەرچوو. ئێمە حەوت برا دەستمان بە کار کرد. زۆربەی کاتمان لە ژێر زەویدا خەریکی پۆڵا و ئاسن و پیک و ئەم جۆرە شتانە بووین. بەڵام هەر شمشێرێکمان دروست دەکرد هیچی لە سندان نەدەکرد. خۆی ئەبو بە دوو لەتەوە. لە ئاکامدا لە شەوێکی تاریک و سارد و سڕی زستاندا شمشێرێکمان دروست کرد کە توانی سندانی قورس و قایم بقڵیشێنێ. سندانەکە قوتولەیەکی بچووکی تێدا بوو. قوتولەکە لەتێ کاغەزێکی تێدابوو؛ لە سەری نووسرابوو:

“کوڕە ئامۆزا شمشێرسازەکانمان؛ بە قوربانی شمشێرە تیژەکەتان، زوو بەزوو وەرن لە دوومان. زۆر بێ ئۆقرەین بۆتان. بیابانی چۆڵ و هۆڵمان بە درەخت چاندوەو کردومانە بە دارستان. ناو نیشانی ئێمە لە یەکەمین هەڵاڵە سوورەی بەهاری بپرسن”.

<<کچە ئامۆزاکانتان>>

ئەم نووسراوەیە بە تەواوی ئێمەی هەژاند دەمانوویست هەر ئەو شەوە هەستین و بڕۆین بە شوێن کچەکاندا. بەڵام نە ناو نیشانی ئەوانمان دەزانی (تا بەهار) نە ئەشمان توانی ئیشەکەمان بە جێ بێڵین. بڕیار بوو بۆ پێشمەرگەکانی شار پێش ئەوەی زستان تەواو بێت؛ هەزار شمشێری تیژ دروست بکەین وەها ڕێکەوت کە زستان خۆی درێژ کردەوە و بەهار درەنگ گەیشتە بەرۆ. ئێمەش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بێ ئۆقرەتر و بێ ئارامتر دەبووین. تازە بەفر چوو بووەوە، لە سەر تەپۆلکەیەکدا هەڵاڵەیەکی سوور و گەورەمان بینی کە خاڵێکی ڕەش و گەورە لە ناویدا بوو. لە هەڵاڵە برمەمان پرسی:

“کچە ئامۆزاکانمان لە کوێن؟ ناو نیشانیان بڵێ؟”





هەڵاڵە برمە سەری بەرزکردەوە وتی: "ئامۆزا ماچم بکە تا پێت بڵێم".

من نووشتامەوە و هەڵاڵەم ماچ کرد. ئەو کاتە هەڵاڵە وتی: "ئەمساڵ زستان زۆر بە پەرۆشی تێپەڕی و بەهار دێر هاتە لامان. کچە ئامۆزاکانتان زۆر پەرۆش و بێ ئارامن. ئەوەندە بێ ئارامن ئەگەر زوو بە زوو فریایان نەکەون لە وانەیە خۆیان بکوژن من ئێوە فێر دەکەم چۆن بچنە پێستی کۆتر یان پێستی ئەسپەوە تاکوو زووتر پێیان بگەن".

پاشــان هەڵاڵــە برمــە نــاو نیشانی کچەکانی پێداین. فێری کردین کە چلۆن بچینە پێستی کــۆتر یــان بچینــە پێســتی ئەسپەوە قسەی ئاخری دیسان لەگەل من بوو. وتی:



"ئــامۆزا زۆر حــەز ئەکــەم مــن دەسکەنە بکەیت و لە گەل خۆت بمبەی... بەڵام چی بکەم زستان هەرچی تۆمی هەڵاڵە برمە بوە، وشکاندویە. ئەگەر منیش نـەبم ئیتر ئەم تەپۆڵکانە کەس نییە جل و بـەرگی سووریان لـە بـەر کـات. باشـتر وایـە مـن دەسکەنە نەکەیت تاکوو تۆمەکەم لـە هـەموو شوێنێکدا بـڵاو بێتـەوە و تەپۆڵکـەکان دیسـان پـڕ لـە هەڵاڵـە بکەم".

له هەڵاڵە جیابووینەوە. شمشێرەکانمان دایە دەستی و ڕۆشتینەوە پێستی کۆتر و بە ڕێ کەوتین. دواتر لە باڵ لێدان ماندوو بووین و چووینە پێستی ئەسپەوە. زەریا و چیا و بیابانمان تێپەڕاند. لە ئاکامدا دوێنێ ئێوارە گەیشتینە ئەم دارستانە چۆڵ و بێدەنگە کۆشکەکانمان بینی؛ رازاندبوونیانەوە. چاوەڕوان دانیشتین. شەو، شەش کۆتری سپی لە شەش سووچی دارستانەوە دەرکەوتن. ئێمەیان بینی شاد بوونەوە. هاتنەخوارەوە و لە پێستی کۆتر هاتنە دەرەوە و بوون بە شەش کیژۆڵەی لە چەشنی مانگ.

وتیان: “کوڕە ئامۆزاکانمان بە خێر بێن”.

پاشان سەیرێکی منیان کرد و وتیان: “ئامۆزا بچکۆلە، تۆیش بە خێر بێت. خوشکی بچووکمان هەڵاڵە وتی: “ئۆقرەت هەبێ. زستانی ئەمساڵ سەخت و درێژ بوو، هەرچی تۆمی هەڵاڵە برمە بوە وشکاندویە ئەگەر هەڵاڵە ئەم کارەی نەکردایە؛ ئێوە ئێمەتان بۆ هەمیشە ون دەکرد. چوونکا ئیتر تۆمێک نەبوو کە ببێ بە گوڵ و ناونیشانی ئێمە بداتە دەستی ئێوە. ئەگەر خوشکمان هەڵاڵە



خوێنی خۆی نەڕژاندایەتە سەر زەوی؛ زەوی بۆ هەمیشە هەڵاڵەی لە بیر ئەچوەوە ئیتر خەڵکیش گوڵی هەڵاڵەیان چاو پێ نەدەکەوت".

من بە بیستنی ئەم قسانە لەوەدابوو شێت بم. قیڕاندم؛ ئەرێ ئەو هەڵاڵە سوورەی تەپۆڵکەکە هەڵاڵەکەی خۆم بوو.

خوشکەکانی وتیان: "بەڵێ ئەو هەڵاڵە سوورەی سەر تەپۆڵکەکە 'هەڵاڵە'ی خوشکمانە. ئەو نەیدەویست خەڵکی وا بزانن بە راستی هەڵاڵەیەک لە دەشتدا نەماوە. دەیویست دیسانەوە تەپۆڵکەکەکان پڕ لە رەنگی سووری هەڵاڵە بکات. خۆشەویستی و لە خۆبوردوویی ئەو لە ئێمە زیاتر بوو. ئەو خۆی قوربانی ئێمە و زەوی کرد".

لە پڕ بە بیرمدا هات بگەڕێمەوە هەڵاڵەکە دەسکەنە بکەم بەڵام لەخۆبوردوویی هەڵاڵە ئەوەندە گەورە بوو کە بێ دەنگی کردم. کچە ئامۆزاکانم منیان بردە کۆشکە چۆڵ و هۆڵەکەی هەڵاڵە. دوێنێ شەو هەموومان لە کۆشکی هەڵاڵەدا بووین؛ ئا لەم کۆشکەدا.

کچە ئامۆزاکانم وتیان؛ هەڵاڵە منی زۆر خۆش دەویست. زۆریش ئیشی دەکرد بۆ درەختەکانی دارستانەکە؛ لە چاوانەی سەر کێوەکە ئاوی بۆ دەهێنان. کچە ئامۆزاکانم وتیان ماوەیەکە بوونەوەرەکانی راوگەکانی پاشا پڕوپاگەندەیان کردووە لە دارستانەکە کۆچ بکەن. بوونەوەرەکانیش پێیان خۆش بوە نەڕۆن. بۆ رۆژی زەماوەندەکە هەموویان دێن. بەڵام براکانم و کچە ئامۆزاکانم بە بۆنەی منەوە زەماوەندەکەیان دواخستوە. ناهێڵن منیش بگەڕێمەوە بۆ شار. ئەمشەو ئیتر تەنیایی زۆری بۆ هێنام بۆیە وەها دەگریام. ویستم باری دڵم سووک بکەم. سوپاست لێ دەکەم گوێرایەڵی دەردی دڵم بوویت.

کاتێ کاکیلاو بەسەرهاتی خۆی تەواو کرد قووچ عەلی وتی: "مافی خۆتە بگریەیت. منیش کاتی خۆی عاشقی کچی پاشا بووم. بەڵام ئەو منی لە کۆشکی خۆی دەر کرد و ئیتر بە شوێنمدا نەگەڕا".
کاکیلاو وتی: "قینت لێ هەڵ گرت".



قووچ عەلی وتی: "ئیستاش ئەگەر بیبینمەوە عاشقی دەبمەوە. لە جوانی و شۆخ و شەنگیدا وێنەی نییە. بەڵام هەڵسووکەوتی خراپە؛ لە خۆ باییە. من تاڵێک لە مووی هەلالەی تۆ بە هەزاری کچ وەک کچی پاشا ناگۆڕمەوە".

کاکیلاو وتی: "قووچ عەلی؛ ئیتر بە تەنیایی دەژیت"؟

قووچ عەلی وتی: "نە... من لەگەل خوشکی خۆم – هەلالە– ئەژیم".
کاکیلاو وتی: "وتت هەلالە؟ هەر ئەو کچەی لە گەلت مەڕەکان ئەلەوەڕێنێت"؟
قووچ عەلی وتی: "ئەری؛ هەر ئەو کچە ڕوومەت سوورە. ئەوە خوشکی منە".
کاکیلاو هەڵبڵۆقی و وتی: "قووچ عەلی! دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم،بەلام دەترسم لێم تووڕە بیت".
قووچ عەلی وتی: "ئەزانم حەز لە خوشکی من دەکەیت. باشە. هەر ئیستا بڕۆین. ئەگەر رازی بوو لە گەل خۆت بیهێنەوە. مەڕەکانیش بە تەنیایی دەتوانم بلەوەڕێنم".
ئەو کاتە کاکیلاو؛ قووچ عەلی فێر کرد، چلۆن بچێتە پێستی ئەسپ و پێستی کۆتر.

*　　　*　　　*



له ناو ئەشکەوتەکەدا هەڵاڵە خەریک بوو ڕیشی بزنەکانی دائەهانی. هەر کاتێ خەوی نەهاتایە و تەنیا بوایە، ئەم کارەی دەکرد. بزنەکان بە نۆرە دادەنیشتن و چیرۆکی هەڵاڵەیان گوێ دەگرد. مەڕەکانیش گوێیان بۆ ڕادەگرت. ئەڵبەت هەندێکیان خەوتبوون یان لە سەر خۆ کاوێژیان دەکرد. سەگەکانیش لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا وەنەوزیان دەدا. سەیری مانگی نیوە شەویان دەکرد لە لاسەرووی ئەشکەوتەکەوە سەری لار کردبووەوە و

ناو ئەشکەوتەکەی رووناک کردبوەوە.

هێندەی پێ نەچوو، مانگ بە هەڵاڵەی وت: "هەڵاڵە هەستەوە ئاگرەکە داگیرسێنە؛ من ئیتر ناتوانم لەمە زیاتر بمێنم، دەڕۆم".

هەڵاڵە هەستا لە بەردەم ئەشکەوتەکەدا ئاگرەکەی داگیرساند مانگ بە ئەسەم لەبەردەم ئەشکەوتەکە داخزا و رۆیشت. چیرۆکەکە بە تازەیی تەواو بوبوو کە دوو کۆتر هاتنە ناو ئەشکەوتەکەوە. یەکێکیان سپی سپی و ئەوی دیکەشیان سپی بەڵام خاڵێک بە سەر سینگیەوە بوو.



هەڵاڵە وتی: "بەستەزمانەکان ڕێگەتان ون کردوە؟ وەرن بۆ لای خۆم".



کۆتری سپی سەیری کۆتری خاڵداری کرد وەک بلێی؛ قەینا بڕۆمە لای.
پێی وت: "بڕۆ بۆ لای مەترسە".
کۆتری خاڵدار ڕویشت و لە سەر دەستانی هەڵاڵە دانیشت. هەڵاڵە سەیری کرد و ماچی کرد ئەو کۆترەکەی دیکەش هات و لە داوێنی هەڵاڵە دانیشت.

دواتر هەڵاڵە هەر دووکیانی لە سەر زەوی دانا و وتی: "لێرە بن با بڕۆم دانتان بۆ بێنم".

هەڵاڵە ڕۆیشت و بن بەردێکی هەڵدایەوە، کونێکی تێدا

بوو دەگەیشت بە ئەشکەوتێکی بچووکتر. ڕۆیشتە ژوورەوە، کۆترەکان زوو لە پێستیان هاتنە دەروە. سەگەکان پاش دیتنی قووچ عەلی هاتن و لای دانیشتن. هەڵاڵە بە دەستی پڕ گەنم گەڕایەوە سەیری کرد براکەی لە گەل کوڕێکی گەنجی بالا بەرزی بەدەماخ، لە ئەشکەوتەکەدا دانیشتون و کۆترەکانیش نین.
وتی: "قووچ عەلی باشە تۆ بۆ کوێ ڕۆشتبووی؟ بۆ ئەوەندەت پێ چوو"؟

قووچ عەلی وتی: "ئیستا وەرە ئەم دۆستە تازەیەم بناسە. دوایی پێت دەڵیم. ئەم هەڤاڵەی من بە شوێن تۆدا هاتوە بۆ ئێرە".

هەڵاڵە لە پێشا بێ دەنگ بوو پاشان وتی: "کۆترەکانی منت نەدیوە بۆ کوێ ڕۆیشتن".
قووچ عەلی وتی: "ئێمە هاتینە ژوورەوە هەڵفڕین چوونە دەرەوە من دەڕۆم بیاندۆزمەوە. لەوە ناچێ لێرە زۆر دوور کەوتبێتنەوە".

قووچ عەلی ئەمەی گوت و رۆیشتە دەرەوە. لە سەر بەردێک روو بە دەشتەکە دانیشت. ماوەیەکی پێ نەچوو سەیری کرد هەڵاڵە و کاکی‌لاو دەستی یەکتریان گرتوە و دێنە دەرەوە. وتی پێیان:

"پیرۆزە".

کاکی‌لاو وتی: "هاوڕێ؛ ئەگەر کێشە نییە من هەر ئیستا دەمەوێ لە گەل هەڵاڵە بگەڕێمەوە بۆ دارستان بۆ ئەوەی کچە ئامۆزاکانم و براکانم دڵ لە دوام نەبن".

قووچ عەلی بە بزەیەکەوە بە هەڵاڵەی وت: "هەڵاڵە، کۆترەکانت ناوێ بۆت بدۆزمەوە"؟

هەڵاڵە بە بزەیەکەوە وڵامی دایەوە: "وازبێنە قووچ عەلی. چاک گاڵتەم پێ دەکەی.. ئەمشەو گاڵتە کردنت گوڵی کردوە".

ئەو کاتە هەر سێکیان دایانە قاقای پێکەنین؛ کاکی‌لاو بە قووچ عەلی وت:

"سبەی ئێوارە چاوەڕێتین وەرە بۆ زەماوەندمان بۆ دارستانەکە".



**پاشان ڕۆیشتە پێستی ئەسپێکی سپی سپی و هەڵاڵـەی لەسـەر کۆڵی خـۆی سوار کرد و بـەڕێ کەوتن.**
**قووچ عەلی تا بەرەبەیان و قووقەی کەڵەشێر هەر لە سەر ئەو بەردە دانیشت و نەخەوت.**
**پاشان ڕۆیشت و لە تەنیشت ڕانەکەیدا نووست.**

*          *          *

**سبەی شەو دارستان پڕ لە شادی و خۆشی بوو. هـەرچی پەلـەوەر و گیانلەبـەر و مـار و مێـرو بوو لە چوار سووچی ئاسمان و زەوینەوە، هاتبوون. لە سەر و لە ژێر درەختەکان، لە ناو خاک و لە ناو زەویدا هێلانەیان دروست دەکرد. حـەوت بـرای ئاسنگەر لـە گـەل ژنـە جـوان و شۆخ و**

شەنگەکانیاندا لە دەوری مێزێکی گەورە دانیشتبوون و چێشتی ئێوارەی زەماوەندیان دەخوارد. قووچ عەلیش هات بوو.

بڕیاریان وەهابوو کە بووک و زاواکان نیوەشەو دارستانەکە بە جێ بهێڵن و بگەڕێنەوە بۆ شار. دەیانویست قووچ عەلیش لەگەل خۆیان ببەن بەڵام رازی نەبوو و وتی: "من دەبێ ئاگام لە مەڕ و بزنەکان بێت".

نیوە شەوان حەوت زاوا دەستی یەکتریان گرت، رۆیشتنە پێستی کۆتر و هەڵفڕین. قووچ عەلی هەندێک لە نێو دارستانەکەدا سووڕایەوە بەڵام نەیتوانی خەمی تەنیایی خۆی لە بیر باتەوە. لە ئاکامدا لە ژێر درەختێکدا دانیشت و ماوەیەک گریا. نەختێک باری دڵی سووک بوو. دواتر هاتەوە بۆ ناو ئەشکەوتەکە بۆ لای رانەکەی..

شوان دیسانەوە بێ دەنگ بوو. چاوانی بڕیە چاوی کچەکە. دەیویست کاردانەوەی قسەکانی لە نێوچاوانی کچەدا ببینێت. کچە بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی: "دیسان بڵێ. بڵێ قووچ عەلی چی بە سەر هات"؟؟

شوان وتی:

"بۆ سبەی ئێوارە قووچ عەلی دیسانەوە کەوتەوە بیری کچی پاشا و هەستی کرد هێشتا لە قووڵایی دڵیەوە خۆشی دەوێ".

لە بەر خۆیەوە وتی: "ئەگەر نەتوانم بیهێنمەوە سەر عەقڵ و بیکەمەوە بە ئینسان ناوی خۆم دەگۆڕم. خۆم دەزانم ئەبێ چۆن بکەم کچی پاشا هەڵسووکەوتی حەیوانی خۆی وەلا بنێت. ئەبێ لەو ژیانەی کە تێیدایە دووری کەمەوە".

ئەو کاتە چوە پێستی کۆتر و ڕۆیشت بۆ باخی کچی پاشا. ئەوەندە چاوەڕوانیی کرد تا کچە هات و ڕۆیشتە نێو گۆمی شیرەکەوە. قووچ عەلیش هات و بە سەر لقی دارهەنارەکەی پاڵ گۆمەکە نیشتەوە و وتی:



“ئەی کیژە جوانکیلە. تۆ چەند لەشت جوانە! من عاشقی تۆ بووم. تکات لێ دەکەم لە نێو شیرەکەدا وەرە دەرەوە تا بە جوانی سەیرت کەم”.

سەرەتا وەک سەگی هار قوولە قوولی کرد، جنێوی ئەدا، دەستووری ئەدا، بەڵام دواتر لە بیری چوو کچی پاشایە و چەشنی کچانی دیکە هێمن و هێور بوەوە. وتی: “ئەی کۆتری خۆش کەلام! تکات لی دەکەم سەیری من مەکە؛ جوان نییە”.

قووچ عەلی وتی: “ئەی کیژی جوانکیلە! بە دەستی خۆم نییە سەیرت نەکەم؛ خۆشم دەوێی”.

کچە وتی: “ئەی کۆتری خۆش کەلام! من ناتۆانم عەشقی کۆترێک قەبووڵ بکەم ئەگەر بە راستی ئەویندارێکی راستەقینەیت لەم دۆخەی خۆت وەرە دەرەوە با منیش سەیری تۆ بکەم”.

قووچ عەلی لە پێستی خۆی نەهاتە دەرەوە. کچی پاشا رازی بوو بەوەی خەوی خۆی بداتە قووچ عەلی تاکوو ئەویش لە پێستی خۆی بێتە دەرێ. قووچ عەلی خەوی کچەی گرت و هەڵفڕی

و ڕۆیشت. لەو ڕۆژەوە ئیتر کچە خەوی لێ نەکەوتوە. ئەوەندە بێ خەوی کێشا، نەخۆش کەوت و کەوتە ناو جێگاوە. دوکتۆرانی شار نەیانتوانی دەردی دەرمان کەن. چوونکا پاشا فەرمانی دابوو کەس بۆی نییە دەستی چەپەڵی لە لەشی کچە بدات.

ڕۆژێک قووچ عەلی خۆی کرد بە چارەسەرکەرێکی پیر و نامۆ. ڕۆیشتە لای پاشا. دواتر ڕۆیشتە لای کچەکەی، گۆایە بێ ئەوەی دەستی لێی بکەوێت تیماری دەکات. ماوەیەک کچەی سەیر کرد وا بزانن تیماری دەکات. پاشان وتی ئەگەر کچە ئەفسانەی خۆشەویستی ببیستێت چاک دەبێتەوە. بەڵام کەس لە شارا ئەفسانەی خۆشەویستی نەدەزانی.

قووچ عەلی دیسانەوە خۆی کرد بە چارەسەرکەری پیر و نامۆ؛ هات و بە پاشای وت: “لە فلانە کێودا شوانێکی لاو هەیە، ئەفسانەی خۆشەویستی بە چاکی دەزانێت. ئەگەر پاشا خۆی بچێت بە دوایدا، دێت بۆ چارەسەرکردنی”.

* * *

شوان دیسانەوە بێدەنگ بوو سەیری چاوانی گێژ و وێژی کچەی کرد پێکەنی و وتی: “ئەی کیژە جوانکیلەکە! ئەی قیزخانم! چارەنووس وەها بوو؛ باوکت کە رۆژێ منی وەک سەگ لە ماڵی خۆی کردە دەرەوە. خۆی هاتە کۆیستان و منی بۆ لای تۆ هێنایەوە. ئیستا چی دەڵێیت”؟؟





قیزخـــانم نـــەیتوانی خـــۆی راگرێت و دەستی کردە گریـان و وتی: "قووچ عەلی؛ من ئیتـر بـۆ هەمیشە لـە بیـری دەکـەم کچـی پاشام. من تۆم دەویَ من ئێستا دەزانــم چەنــدە پێویســتم بــە ئەوینی تۆ هەیە. منیش لە گـەل خـــۆت بـــەرە. دەمـــەویَ وەک هـــەموو خـــەڵکانی دیکـــە ژیـــان بەرمە سەر".

قووچ عەلی وتی: "ئاخر بۆ تـۆ کـاریّکی ئاسـان نییــە چەشـنی

خەڵکانی دیکە ژیان بکەیت. چوونکا تۆ لە نێو ناز و خۆشیدا گەورە بوویت. بەڵام ئەگەر بتهەوێت دەتوانی بە ژیانی نوێت رابێیت و بساچیت".

قیزخانم وتی: "ئەگەر لە گەل تۆ و لە نێو خەڵکدا بم هەموو کارێک بۆ من ئاساییە. قووچ عەلی! منیش لە گەل خۆت بەرە. قیزخانم بە تەنیا جێ مەهێڵە".

قووچ عەلی فرمێسکەکەی سڕی و سێویکی دەرهێنا لە گیرفانیدا و وتی: "ئیستا تۆ ماندووی. وەرە ئەم سێوە لە دەستی من بگرە و بیخۆ؛ پاشان دێمەوە بۆ لات. تۆ ئیتر منت خۆش دەوێ؛ دەزانم".

کچە جوانکیلەکە سێوەکەی وەرگرت و خواردی. راکشا بە پشتا ئەو کاتە چاوانی هێدی هێدی قونجاند و چوە خەوێکی شیرین.

قووچ عەلی هەستایەوە و ماچێکی سەر گۆنای کچەی کرد و رۆیشتە دەرەوە. وتی بە پاشا: “خەوی کچەکەتم پێ دایەوە تا سێ رۆژ کەس بە دەور و بەری کۆشکەکەیدا نەڕوات. با خەوی نەشێوێت. رۆژی چوارەم بڕۆن هەڵیسێنن”.

کازیوەی رۆژی دواتر، هەتاو دەر نەکەوتبوو قووچ عەلی لە پێستی کۆتردا هات بۆ لای قیزخانم. لە پێستی کۆتر هاتە دەرەوە و گوڵێکی سووری لە ژێر لووتی کچە راگرت. کچە چاوانی کردەوە و بێ دەنگ و لە سەر خۆ پێکەنی.

قووچ عەلی وتی: “خۆش خەوتی”؟

قیزخانم وتی: “خەوێکی خۆشم کرد. هەر وەک شەکر و هەنگوێن شیرین و خۆش بوو. ئیستا من لە گەل خۆت دەبەی”؟

قووچ عەلی وتی: “بە چاوان... ئیستا هەستە برۆین لە ناو باخدا خوت بشۆرە پاشان دەڕۆین”.



*           *           *

تازە هەتاو هەڵاتبوو، دوو کۆتری سپی لە سەر چڵی هەناری قەراخ گۆمەکە هەستان و بەرەو ئاسۆیەکی پرشنگدار هەڵفڕین.

2002ی زاینی
سەوڵاوا / مەریوان